ئەمینداریتی ی گشتی ی
رۆشنبیری و لاوان

# مەقامەکانی

## شێوەی هونەرمەندی کورد
## لە تەرازووی رەسەنایەتی دا



نوسینی
کەریم شارەزا

ئه‌میندارێتی ی گشتی ی
رۆشنبیری و لاوان

# مه‌قامه‌کانی

## شێوه‌ی هونه‌رمه‌ندی کورد
## له‌ ته‌رازووی ره‌سه‌نایه‌تی دا

نوسینی
که‌ریم شاره‌زا

# ووشەیەك

خوێنەری بەڕێز ... ئەوەی لەم کتێبەدا دەی خوێنیەوە ، لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر گۆرانیو مەقامەکانی سێوەی مەقامبێژی هونەرمەندی کورد ، لەگەڵ دەست نیشان کردنی دەوری شاری کۆیە لە کاروانی ئاوازو گـۆرانیی کوردیدا .

ئەو ئارەزووەی پاڵی پێوەناوم بۆ ئەم کارەم ، بە ڕادەی یەکەم ئاگادارییمە لە ژیانو هونەری ئاوازو گۆرانییەکانی سێوەی هونەرمەندی ڕۆڵەی ئـەو شارەی کۆیە ، کە خۆشم پەروەردەی جوانیو خۆشی دیمەنە دڵگیرەکانیم . ئەو ئاگاداریی‌یەشم دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی چلەکان ، بۆ نەورۆزی ١٩٤٥ ی ئەو شارە زیندووە ، کە بۆ یەکەم جار ئاهەنگی نەورۆزی بە ئاشکرا تێـدا گێڕدراو گوێم لە دەنگو ئاوازە کوردی‌یە ڕەسەنەکانی بووەو مەستی دەنگە خۆشەکەی بووم‌و ، هەردەم حەزم کردووە لە نزیکەوە بیناسم‌و گوێ لە گۆرانی‌یەکانی ڕابگرم‌و سەرخۆشی ئاوازە پڕجۆش‌و خرۆشەکانی‌بیم .

کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٨ دا (کۆمەڵی بووژاندنەوەی هونەوە جوانەکان)-مان لە کۆیە دامەزراند ، سێوەی هونەرمەندمان وەك ئەندامێکی فەخری لەو کۆمەڵە وەرگرت‌و گەلێ مەقامی ڕەسەنی کوردی بە یارمەتی تیپی مۆسیقای باواجی یا تیپی مۆسیقای مەولەوی بۆ لەسـەر شانۆی ئاهەنگەکانی ئەو کۆمەڵەمان پێشکەش بە جەماوەری شارەکانی کۆیەو سلێمانیو ڕانیەو هەولێر کردووە .

کە لە نووسینەکەم بوومەوە لەسەر داوای یەکێتی نووسەرانی کورد لقی هەولێر لایەنە ئەدەبی‌یەکەیو لەسەر ئارەزووی کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردیش هەر لەم شارەدا لایەنە هونەری‌یەکەیم لە هاوینی ١٩٧٩ دا پێشکەش بە ئەدیب‌و هونەرمەندان کرد .

ئەوەی لەکاتی پێشکەش‌کردنی کۆڕەکاندا هەستم پێ‌کرد ، کەم هێزی لایەنە هونەری‌یەکەیان بوو ، پتەو کردنی ئەو لایەنەش لەتواناو دەستەڵاتی من دا نەبوو ، چونکە من مۆســـیقا زان نیم تاکو نۆتە بۆ ئاوازەکان دابنێم‌و شیتەڵیان بکەم · بۆیە وام بە پەسەند زانی روو لە چەند مۆسیقا زانێــکی هونەرمەندی کورد بکەم بۆ تەواو کردنی ئەو لایەنەی باســـەکەم · لەوانە هەنەرمەندان (وریا ئەحمەد) لە هەولێرو ئەنوەر قەرەداخی لە سلێمانی بە دوا دەنگمانەوە هاتن یەکەمیان نۆتەی مۆســـیقای سێ گـۆرانی بۆ دانام‌و دووەمیشیان ئاوازی مەقامەکانی (عایشە گوڵ) و (گوڵێ) ی‌بۆ شیتەڵ کردم وام بە پەسەند زانی نۆتەکان لەگەڵ گۆرانیەکاندا بلاوبکەمەوەو نووسین‌و شیتەڵ کردنەکەی مۆسیقازان ( ئەنوەر قەرەداخی) یش وەکوو خۆی بکەم بە پاشکۆی کتێبەکەم · ئیدی هیوادارم توانی بێتم خزمەتێکی ئەدەب‌و هونەری کوردی بکەم ·

کەریم شارەزا
هەولێر ١٩٨٠/٢/٤

# ئاوازو گۆرانی کوردی

گەلی کورد لە سەرەتای بوونیەوە تاکوو ئەمڕۆی ، خاوەنی هونەری ئاوازو گۆرانیی تایبەتی خۆی بووەو . ئەو هونەرەیشی بە پێی قۆناغو سەردەمی ژیانی ، وەك راستییەك ، هەردەم لە بازنەو بواری سەرخانی ژیانی ئابووریی کۆمەڵگاکەی‌و دەستەو چینە کاربەدەستەکانی ئەو سەردەمەیدا سووڕاوەتەوە .

هەرچەندە دیوی دووەمی ئەو هونەرەیشی بۆ سوودو ماندوو حەسانەوە، یا بۆ ئاخ هەڵڕشتنی چینە زەحمەتکێشەکانیشەوە خوڵقابێ بەڵام ئەو رێگاو بوارە ئاشکراو فراوانەی پێ نەدراوە ، تا وەك دیوی یەکەمی گەشـــە بکاو بکەوێتە ناو ئەنجومەنی کاربەدەستان ، تا بایەخی شایستەی خۆی پێ بدرێ .

هونەری ئاوازو گۆرانیی کوردی بە هەردوو دیوەکەیەوە ، لە هەمان سەرچاوەوە سەریان هەڵداوە ، ئەویش ژیان‌و دەورو بەرەکەیەتی ، چونکە جگە لە بارە ئابووریەکەی ژیانی ئینسانی کورد ، سروشتی دەورو بەرەکەیشی بە شێکی جودا نەکراوە بووە لە ژیانەکەی ، دەورێکی کاریگەری بووە لـــە خوڵقاندنی ئەو هونەرە جوانەدا .

بۆیە دەتوانم بڵێم : لە کۆنەوە ئاوازو گۆرانی کوردی هەر ڕەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵەکەی‌و دەنگدانەوەی ئاوازە سروشتییەکانی نێو جەرگەی خاکە دڵگیرەکەی بووە ! هەر لە هاژەی بەفراوانی کوێستان‌و خوڕەی تاڤگەی قەد پاڵی کێوە بەرزەکان‌و شلپەی شەپۆلی رووباری ساردو سازگارو شنەی شەماڵی فێنکەوە بگرە ، تا دەگاتە قاسپەی کەوی سەر رەوەزە چیا بەرزەکان‌و چریکەی شالوورو بولبولانی نێو باخ‌و رەزان ، تا تێکەڵ دەبن بە ترپەی پێی کچی نەشمیلان‌و ئاوازی لە نجەی یاری شۆخ‌و شەنگ‌و خورپەی دڵی ئاشقان‌و ناڵەی هەژاران .

ئەمانە هەموویان بوون بە هەوێنی ئاوازی گۆرانی کوردیو هەستێ ناسكو جۆشێکی گەرمو گوڕیان خستۆتە ناو دڵو دەروونی سەرجەم رۆڵەکانی کورد ، بە گشتیو دەستەی خۆشخوانو گۆرانی بێژانی بە تایبەتی

خۆشخوانو گۆرانی بێژیش لە رێگەی هەست ناسکیو بەهرە هونەرییانەوە ، توانیویانە ئاوازی خۆشو دڵکێش دابهێنن و بە دەنگە زوڵاڵیان مێشکی گوێگران مەست بکەنو گۆرانیو مەقامی رەسەنی کورد بخولقێنن و پشتاو پشت بۆمان بەجێ بهێڵن و بە پێی دەورو قۆناغ زاخاو بدەنەوەو لەگەڵ چێژو ئارەزووی خەڵکەکەیدا بگونجێنن و گەشەی پێبکەن و خۆشیان لە رێگەی بەهرەی هونەرییانەوە جێ پێی خۆیان لەسەر زەمینە پتەوی کۆمەڵەکەیان بچەسپێنن و ، خۆیان بە چینو توێژەکانی گەلەکەیا بسەلمێنن .

هەر چەندە جاران خۆشخوانو گۆرانی بێژ وەك هونەرمەندێکی ئێستە چاویان لێ نەکراوەو ، رێزیان لێ نەگیراوە ، بەڵام هەردەم لە قۆناغو مەجلیسی میرو ئاغاو کار بەدەستاندا ، لە کوێخاو گزیرو سەرکارو پاکارو بەردەستە ماقوولتر بوون[1] .

چونکە هیچ دابو دەستورێکی خۆشیو شادیی خەڵکەکە بە بێ ئاواز گۆرانیو گۆرانی بێژان مەیسەر نەبووە ، هیچ شاییو گۆوەندی بوو گواستنەو ئاهەنگی شەوارەو سونەتانە ، بەبێ سازو ئاوازی دەهۆڵو زوڕنا یا بلوێرو شمشاڵو گۆرانیی خۆشخوانان نەگێڕدراوەو ، هیچ هەڵقەی زیکری صۆفیانو ، ئاهەنگی خوێندنەوەی مەولودنامەی پێغەمبەر ، بەبێ ئاوازی دەفو دەنگی زوڵاڵی مەقامبێژی هونەرمەند نەگێڕدراوە .

---

(١) پێشەکی (توحفەی موزەفەرییە)ی ئۆسکارمان ـ ساخکردنەوەی هێمن . بەغدا ـ کۆڕی زانیای کورد ـ ساڵی ١٩٧٥ ، بەشی یەکەم ، ل٨ .

به کورتی هونەری ئاوازو گۆرانیی کوردی ، هەروەك لە دڵو دەروونی رۆڵەکانی گەلەکەیو لە سروشتی خاکەکەیەوە پسکاوە ، لە هەمان کاتیشدا بووە بە بەشێکی بنەڕەتی لە خووڕەوشتی رەسەنی تەتەوایەتی گەلی کوردو ، هەرگیز لێی جودا ناکرێتەوە ·

بۆیە هەر لە کۆنەوە بە دەیان ، بەڵکوو بە سەدان ئاوازی گـــۆرانی ڕەسەنی کوردی لەناو رۆڵەکانی گەلەکەماندا خولقاوەو ، خاسیەتێکی تایبەتی نەتەوایەتی خۆی وەرگرتووە کە بە ئاسانی لە ئاوازی نەتەوە دراوسێکانی جودا بکرێتەوە ، وەك ئاوازەکانی ڕاستو سێگاو چوارگاو پێنج‌گاو عەجەمو بەیاتو حیجازی کوردو موحەیبەرو ئۆرفەو نیوەشـــەو ئاوازەکانی لاووکو حەیران و بەستەی خۆماڵی ·

شاعیری نەوەیی کـــورد ( ئەثیری = ئەســیری ۱۸۹۰ــ۱۹٦۲) وەك شارەزاینکی سازو ئاوازی کوردی هەستی بەوە کردووەو ، هەندێ لـەو ئاوازە کوردی‌یانەی لەناو هۆنراوەیەکی‌دا بە ناونیشانی « رۆڵەی کوردم» ناو هێناوەو دەڵێ :ــ

کابرا ســـەروانە ماڵو خـانەیی وێرانی مـن
تێبگە تەحسیلو کەسبو کردەوەو عیرفانی من
ئیدیعایی عیلمی مۆسیقای ئەمن ئیسپات ئەکا
راستو سێگاوو بەیاتو لاوکو حەیرانی من(۱)

وە لە ئامێرەکانی مۆسیقاش ، گەلی کورد ئاشنایەتی لە گـــەڵ ئامێری مۆسیقای رۆژهەڵاتی وەکوو : « دەفو دەهـــۆڵو زوڕناو بلوێرو شـــمشاڵو کەڕەناو دووزەلەو باڵەبانو عوودو سازو ســـەتوورو جومبوشو چەنگو

---

(۱) ئەسیری ــ کەریم شارەزاو جەبار جەباری ــ هەولێر ۱۹۷٤ ، ل ٦٥ ·

زیلو بەمو نەققارە » • بووەو ، گۆرانی بێژە هونەر مەندەکانی ، ئاوازی گۆرانیو مەقمەکانیان پێ سازکردوون •

# کۆیەوکاروانی ئاوازوگۆرانی کوردی

کۆیە شارێکی مێژوویی کـــوردە ، لە کۆنەوە ناوچەیێکی بازرگانیو رۆشنبیریی زیندووبووەو هەردەم کاروانەراو قۆناغی سەرە رێی کاروانی بازرگانی نێوانی عیراقو ئێران بووە • بازارەکـــەیشی هەمیشە پیشانگای بەرهەمە کشتوکاڵیو پیشەسازی‌یە ناوخۆیی‌یەکانی خۆیبووە ، پێویستی‌یە ـ کانی دانیشتوانی ناوخۆیو دەوروپشتیو دەرامەتی بازرگانەکانی ناوەوەو دەرەوەی دابین کردووە •

لە نزیکو لە دوورەوە • زاناو شاعیرو گۆرانی بێژە هەڵکەوتووەکانی کورد روویان تێ کردووەو ، کردوویانە بە مەیدانی جموجوڵیو چالاکی‌یەکانی خۆیانو ، زانیاریو هونەری شیعرو گۆرانییان تێدا بڵاوکردۆتەوەو ، لـــە هەمان کاتیشدا زانستو هونەری تازەیشی لێوە فێربوون(١) •

بەم جۆرە تابووە بە شارێکی بازرگانیی زیندووو ، بە ناوچەیێکی زانستو هونەری شیعرو ئاوازو گۆرانی کوردیی بە ناوبانگ ، بە تایبەتی لە سەدەی نۆزدەهەمدا ، لەو کاتەی کە گەلێ زانای بلیمەتو شاعیرو هونەرمەندی هەڵکەوتوو ، کاربەدەستی زانستو هونەر پەروەری وەکوو [ حاجی بەکر ئاغای (قاصد) ١٧٨٥ـ١٨٥٣ز ] و [ ئەمین ئاغای ئەختەر ١٨٣٩ـ١٨٨٧ز ] ی شاعیری هونەرمەندی کوڕە گەورەی سەریان هەڵداوە ، کـــە بەدرێژایی تەمەنیان کۆڕو دانیشتنەکانی نێو دیوەخانەکەیان هەردەم گۆشەی ئەدەبو

---

(١) گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە (٤٧)ی ساڵی ١٩٧٨ ، ل ٦٠ ، وتارێك لە سەر سێوە •



**( کۆیە شاری ئەدەب هونەری کوردی )**

هونەری رەسەنی کوردی بوون ، هەروەکوو مامۆستا (مەسعوود محەمەد) لە بەشی یەکەمی کتێبەکەی ( حاجی قادری کۆیی ) دادەڵێ « ئەمین ئاغاش وەك باوکی ئەدیبو شاعیرو هونەر پەروەر بووە ، هەمان کۆبوونەوەی رۆشنبیری سەردەمی باوکی لە دیوەخانەکەیدا بەردەوام بووە ، بە زیاد کردنی کەرەستە ـ یەکی تازەی زەوقو ئارایشت کە گۆرانیو مۆسیقا بووە » [1] .

نووسەری ناوبراو لەسەر باسەکەی دەڕواو دوا بە دوای ئەمە دەڵێ :ـ « لە سەردەمی ئەمین ئاغادا بازاڕی گۆرانیو مۆسیقا سەر لەنوێ کەوتەوە گەڕ ، فیزگەی بەستەسازیو مۆسیقاشناسی کە میراتێکی یەکجـــار کۆنی

---

(١) حاجی قادری کۆیی ـ بەشی یەکەم ـ مەسعوود محەمەد ـ بەغـــدا ١٩٧٣ ، ل ٢٠٦ .

رابوردووی کۆیەیە ، نوێ بووەوەو بووژایەوە ، جگە لە کۆیە جێگەی دیکەش هەبووە لە کوردستان مەجلیس‌و رابواردنی وەهای تێدا بووە ، بەڵام گومانم لەوەدا نیە لە ڕووی وەستایی‌و هونەرکاری‌یەوە هاوتای دانیشتنەکانی دیوەخانی ئەمین ئاغا یەکجار کەم هەبووە . چونکە ڕێکەوت وابوو ئەمین ئاغا بۆ خۆی شاعیرێکی هێژا بووە ، لە کوردی‌و فارسی‌و بەشێکی زۆری لە بەیتی گۆرانی‌و بەستەکانی خۆی دەیهۆندنەوە ، ئەوەی خەڵکی دیکەش هەڵی بەستبان لە پێش چاوی ڕەخنەگرو نیگای پڕ هونەری ئەودا تێپەڕ دەبوو ، ئەوجا دەبوون بە گۆرانی‌و دەخرانە قاڵبی مۆسیقاوە »[2] .

بۆیە ئەو شاعیرو زانایانەی هاونشینی ئەمین ئاغای ئەختەر بوون هەر لە حاجی قادری کۆیی ( ١٨١٦ ـ ١٨٩٧ز ) و ( حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە ١٨٣٤ ـ ١٩٠٨ز )ەوە بگرە تاکو دەگاتە ( شێخ ڕەزای تاڵەبانی ١٨٣٢ ـ ١٩١٠ز )[3]و کەیفی جوانڕۆیی‌و موجرمی شاعیر ( ڕەشید ئاغای حاجی بەکر ئاغای برای ئەختەر ) ، هەموویان لە پاڵ زانست‌و ئەدەبەکەیانەوە، نەك هەر بنچینەیێکی باش ، بەڵکوو زانیاری‌یەکی تەواویشیان بووە لە هونەری مۆسیقاو مەقاماتی کوردی ، بۆیە شیعرەکانیان‌وا سوارو مۆسیقادار بوون‌و ، بە ئاوازی خۆشی مەقامی کوردی لەو کۆڕو دانیشتنانەی (ئەختەر)دا لە لایەن مەقامبێژی بلیمەتی کورد (مەڕبێن)ی (قەشەشابیل)ەوە ، بە دەنگە زوڵاڵەکەی گوتراون .

جگە لە شیعری ئەو کەڵە شاعیرە هونەرمەندانە ، بە دەیان بەیت‌و گۆرانی‌ی بە نرخی فۆلکلۆری بە ئاوازی مەقامی ڕەسەنی کوردی‌یەوە بەسەر

---

(٢) هەر ئەو سەرچاوەیەی پێشوو ، ل ٢٠٧ .

(٣) گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات ـ ووتارێکی دوکتور عیزەدین مستەفا ڕەسوول لەسەر شێخ ڕەزا ـ ژمارە (٢٣)ی‌ساڵی ١٩٧٩ ، ل ٣٦ .

.ارو زمانی (مەرِبێن)ی دەنگ خۆش‌و مەقامبێژد هاو چەرخەکانی‌یەوە بوون‌و
ـە دوایشدا کەوتوونەتە سەر زمانی شاگردە زیرەکو هـــونەرمەندەکانی
ـەکوو (حەننا تۆما)ی ناودار بە (حەنیل)و ، [نەشئەتی رەشید ئاغا] و [حاجی‌یە
گەورە] و ( شێخ نەجمەددینی شێخ کەریمی بەرزنجـــی) و (حـوسینی
۱۸۸۸-۱۹۳۳)ی شاعیری دڵتەڕی برای‌و (عەبەی چایەچی)و (لەمینی سەمەن)و
(پووتێ) هەردەم ئاهەنگی بەزم‌و شادیی‌و کۆڕو کۆبوونەوە ئایینی‌یەکانی ئەو
شارە زیندووەیان پێ گەرم‌و پرجۆش‌و خرۆش کردووە ٠

## "مەرِبێن" ی مامۆستای بلیمەتی مەقامی کوردی

مەرِبێن لە دیانەکانی شاری کۆیە بووەو ، کوڕی (قەشە شابیل)ی مامی
باوکی « یاقوبەی باسێ » ی مووریێس بووە ، ئەم یاقوبەیە هێشتا لە ژیانداماوەو
تێر تەمەن بووەو ئێستا لە شاری کەرکوك دادەنیشێ[۱] .

وەك لە لە هەندێ لە برا دیانە بە تەمەنەکانی کۆیەم بیستووە ، مەرِبێن
هاو تەمەنی ئەمین ئاغای ئەختەری شاعیری مـــەقامزاتی کوردی بووەو ،
دەتوانین بڵێین لە دەورو بەری ساڵی ۱۸۳۵ ی زایینی لە کۆیە لە دایك بووەو
هەر لەوێش لە دەورو بەری ۱۸۹۵ داکۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی
هەرمۆتەی نزیك کۆیە بە خاك سپێردراوە[۲] .

ئەو بەیت‌و گۆرانی‌یە کوردی‌یە خـــۆشانەی کـــە تا ئەم دوایی‌یە
بە سەر زارو زمانی گۆرانی بێژە هەڵکەوتووەکانی ئەو شارەی کۆیەوە بوون ،
هەموویان هەر خـوڵقاوو زادەی دارِشتن یا نـوێ کردنەوەو رێکخستنی

---

(۱) ئەم زانیاری‌یەم لە [ مام گۆرگیسی خواجـــە یوسفی کـۆیی ۱۸۹۸]
وەرگرتوە ٠

()۸] هەر ئەو سەرچاوەیەی پێشوو ٠

سەردەمی ئەمین ئاغای ئەختەرو مەڕبێنی مەقامبێژی بلیمەت بوون · ئەو مەقامانەی (نیوەشەو)و (سەحەر)و (بەهار)و (پایز)و (گوڵێ)و (عایشە گوڵ)و ( شەنگ مێرەم )و ( مەکەن مەنعی عاشقان )و ( جەبارە )و ( شلەو خانان )ی شایی رۆینەی کوردی ، کە لەلایەن گۆرانی بێژە هونەرمەندەکانی وەك : « نەشئەتی رەشید ئاغا »و « حەنیل »و « عەبەی چایەچی »و « پووتێ »و « سێوە »و « مەلائەسعەد » تا دوا دوای پەنجاکان دەگوتران ، ئەگەر هەمووشیان لەو شارەی کۆیە دانە هاتبن ، بێ گومان هەندێکیان خوڵقاوی ئاووهەوا هونەرییەکەی بوونو ، بە تێکڕاش لە بواری کۆڕو دانیشتنەکانی ئەمین ئاغاو (مەڕبێن)ی هونەرمەند رێكو پێکترکراون خراونەتە ناو قاڵبی مۆسیقاو ئاوازی رەسەنی کوردییەوە ·

ئەگەر ئێمە سەرنجێك بدەینە ئەو مەقامانەی مەڕبێنی هونەرمەندو ، ئاوڕێکیش بدەینەوە لە سازو ئاوازی ئەو گۆرانیو بەیتانەی کە نزیکن لێیانەوەو ، ئێستا لە ناوچەی موکریاندا دەگوترێن ، بە ئاسانی جیاوازیی هەر دووکیانمان بۆ دەردەکەوێو ، لەو راستییەمان بۆ روون دەبێتەوە ، کە ئاوازو دەقی مەقامەکانی (مەڕبێن) لە سەرەتادا لەناو ئاوو هەوایێکی شارستانێتیی پڕ لە هاتو باتی بازرگانیو لەناو کۆڕو دانیشتنی شارەزایانی ئەدەبو هونەری کوردیی سەردەمی ئەختەرەوە سەریان هەڵداوەو ؛ ئاوازو دەقی مەقامەکانی ئەو دیویش زادەی ئاوو هەوایێکی ترن ، دەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵگای کشتوکاڵینو رەنگدانەوەی نەریتی ژیانی دەشتەکییانەیان پێوە دیارە · بۆیە دەتوانم بڵێم : شاری کۆیە لە کۆنەوە ئەگەر سەرچاوەیێکی هەرە سازگاری سازو ئاوازو گۆرانی کوردیش نەبووبێ ، ئەوا کاروانسەراو قۆناغێکی سەرەکی بووە لە سەرەڕێی کاروانی سازو ئاوازو گۆرانیی رەسەنی کوردی ·

مەڕبێن دەنگێکی خۆشی سیحراوی بووە ، کە شەو رادەشکا و بای

شەماڵ شەوانی هاوینی کۆیەی کۆیەی فێنك دەکردەوە ؛ ئەو مـــەقامبێژە بلیمەتە بە دەنگە دڵکێش‌و خۆشەکەی مەقامی (نیوەشەو) و (سەحەر)ی لـە دیوەخانی ئەختەری شەیدای هونەری کوردی دەگوت ، هەموو دانیشتوانی شاری کۆیە لە خەو راست دەبوونەوەو گوێیان لەو دەنگە خۆشەی مەڕبێنی هونەرمەند دەگرت [1] .

رەك لە هەندێ لە شارەزایانی مەقامی کوردی ئەو شارەی کۆیەم بیستووە[2] مەڕبێن برایەکی لە تاڤی لاویدا جوانە مەرگ دەبێ ، خەڵکی کۆیە بە دوکاندارەوە دەست لە کار هەڵدەگرن‌و دوکانەکانیان دادەخەن‌و لە دوای تەرمی ئـەو جوانە مەرگە تاکو گۆڕستانی گوندی هەرمۆتە دەڕۆن‌و (مەڕبێن)ی کۆســت کەوتووش هەموو جل‌و بەرگی خۆی لە خوم هەڵ دەکێشێ‌و بەپێش تەرمەکەی دەکەوێ،کە دەنێژری ، روو دەکاتە خەڵکەکەو پێیان دەڵێ :ـ « خەڵکینە من ئەمڕۆ بۆ دوا جار لە ژیانمدا گۆرانی دەڵێم ، جا فورسەتە هەر گۆرانی‌یەکی ئارەزووی دەکەن ، داوام لێ بکەن بۆتان بڵێم ، چونکە لە ئەمڕۆ زیاتر گوێتان لە دەنگی من نابێ ، لە دوای جوانەمەرگ بوونی برای شیرینم دڵم ناپشکوێ تا جارێکی دیکە گۆرانی بڵێم ، جا تکایە لەمڕۆ بەدەر نە ئێوەو نە ئەمین ئاغای (ئەختەر) ئەو داوایەم لێ نەکەن . ئیتر لە دوای ئەو کارەساتە (مەڕبێن) لـە خوێندن کەوت‌و چیتر گۆرانی نەگوت‌و مەیدانی ئەو هونەرە جوانەی بـۆ (حەنیل)و (پووتێ)و (عەبەی‌چایەچی)و لە دواییشدا بۆ [ سێوە ]ی مەقامبێژی هونەرمەندمان چۆڵ کرد [1] .

---

(١) رۆژنامەی (هاوکاری) ی‌ژمارە (٢٧)ی رۆژی ١١/٧/١٩٧٠ ، ووتارێکی خوا لێ خۆش بوو محەمەد تۆفیق ووردی لە سەر (مەڕبێن) .

(٢) لەو شارەزاو ئاگادارانە :ـ

(أ) مەقامبێژی خوا لێ‌خۆش‌بوو ، وەستا (محەمەد ئەمینی کوڕی‌و ەستا



# سیوەی مەقامبێژی هونەرمەند

سێوە مەقامبێژێکی هونەرمەندی کورد بوو ، خاوەنی ڕێبازێکی هونەریی تایبەتی بوو لە مەقام گوتندا ، دەنگێکی خۆشی قەبەی گونجاوو لەباری هەبوو بۆ گوتنی ئەو جۆرە گۆرانییانە . هەستێکی مۆسیقایی ناسکی هەبوو ، بە هەوڵدانێکی کەم توانی خۆی بکا بە ئاشنای هەموو جۆرە مۆسـیقایەکی ڕۆژهەڵاتی ، لە کاتی گۆرانی گوتندا ، بە چاکی لەگەڵ مۆسیقادا دەڕۆیشتو دەیزانی لە کوێوە دەست پێ بکاو لە کوێوەش بوەستێ ، دەقی ئەدەبیو ئاوازی مەقامەکانی لە سەرچاوەیێکی پاکو سازگاری کوردەوارییەوە هەڵقوڵاونو بە زۆری لە گیرو گرفتەکانی لاوانو ئەڤینو ڕاستگۆییو وەفاداریو سروشتی خاکی کوردستانەوە دەدوێنو ڕەگێکی قووڵو قایمیان هەیەو بە ناو ویژدانو دەروونی میللەتدا چۆتە خوارەوەو لە زۆر شوێندا/لە بازنەی تەسکی کاتو ڕۆژگار دەچنە دەرەوە ، بۆ ئەوەی بۆ هەموو دەورو سەردەمێکی مرۆڤی کورد دەست بدەن ، بۆیە بە گۆرانیو مەقامی ڕەسەنی کوردی دەدرێنە قەڵەم .

هەر چەندە ئەو مـەقامانەش ، بە دەقی ئەدەبیو ئاوازەکانیانەوە ،

---



صالحی کەبابچی کۆیی) کە لە ساڵی ١٩٠٧ لە کۆیە لە دایکبووە لە ١٩٧٣ لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە .

(ب) کاك ( حەننا سلێمان )ی دانیشتووی گوندی هەرمۆتە کە لە ساڵی ١٩٠٨ لە دایك بووەو ئێستا لە ژیاندا ماوەو ئاگاداری ئەم جۆرە هەواڵانەیە .

(١) ڕۆژنامەی ( هاوکاری )ی ژمارە (٢٧) ی ڕۆژی ١٩٧٠/٧/١١ ووتارێکی خوا لێ خۆشبوو (محەمەد توفیق ووردی ) بە ناونیشانی ( مەربێن دەنگ خۆش) .

رەگو شادەماریان دەچێنەوە سەر مەقامەکانی سـەدەی نۆزدەھەم‌و بـۆ سەردەمی ئەمین ئاغای (ئەختەر)ی شاعیری ھونەرمەندو (مەرێن)ی مامۆستای مەقامی کوردی ، بەلأم ئەو راستی‌یە ئەوە ناگـەیەنێ کە ئاوازی مەقام‌و گۆرانی‌یەکانی (سێوە) کت‌و مت ھەر ھەمان مەقامی ئەو سەردەمەی پێشوو بووبن‌و ھیچ گۆڕانکارییەکیان بە سەردا نەھاتبێ !.

چونکە ھەر وەکوو ئاشکرایە ئەدەب‌و ھونەرو رۆشنبیریی ئاوێنەی بالأنمای ژیانی ئابووری‌و کۆمەلأیەتی گەلانن‌و بە پێی قۆناغ‌و گۆڕانی باری ژیان ئەوانیش دەگۆڕێن‌و پێش دەکەون‌و گەشە دەکەن. لە سەرێکی دیکەشەوە (سێوە) خۆی مەقامبێژێکی ھونەرمەندی بە دەستەلأت بوو ، بە بیرو ڕای گەلێ لە گۆرانی بێژە شارەزاکانمان ، توانای داھێنـانی ئاوازی نوێ‌و تازەکردنەوەی ئاوازی فۆلکلۆری کۆنی ھەبووە ، بە زیاد کردنی شتی تازەو لابردنی نەغمەی سوواوو نەگونجاو لەگەلّ بابەتی مەقامەکەدا[1] .

بۆیە لەکاتی گۆرانی گوتندا ھەمیشـە زالّ‌بوو بەسەر ئاوازی مەقامەکانی‌دا بە توانستی ھونەریی خۆی ، دەسکاری تێدا دەکردن بەبێ لەوەی لە سنووری گشتی‌و لە بنچینە سەرەکی‌یەکانی ئەو مەقامانەش بچێتە دەرەوە[2] .

سێوە لە سەرەتادا ھونەری مەقامی کوردی لە ( ئەشئەتی رەشـید ئاغای حەوێزی ) یەوە فێربووە و ، لە دوایدا بۆ ماوەی سالێك چۆتە لای (حەننا تۆما)ی ناسراو بە (حەنیل)ی شاگردی (مەرێن)ی ئوستادی مەقامی کوردی لە مەلبەندی کۆیە لە سەدەی نۆزدەھەمدا . لە ماوەی ئەو سالەدا ھەموو دەستوورو بنچینەکانی مەقامی کوردی بە دەقی ئەدەبی‌و ئاوازەکانی -

(١) یادداشتە ھونەری‌یەکانی ئەندریۆس خەمۆ (باکووری) کۆیە ١٩٢٨ (دەست‌نووس) ، ل ٥٠ .

(٢) ھەر ئەو سەرچاوەیەی پێشوو ، ل٥١ .

یەوە بە نووسینەوەو لەبەرکردنەوە فێربووەو(١) ، بووە بە مەقامبێژێکی هونەرمەندی لێ هاتووی کوردو ، بە زۆری لەگەڵ گـۆرانی بێژەکانی ئـەو سەردەمەی کـۆیەی وەك (عەبەی چایەچـی)و (پوولێ)و (میناس مـەربێن)و (مەربێنی قەشە گـۆرگیس ١٨٩٢ـ١٩٧٩)و (مەلا نەسـەد ١٨٩٠ـ١٩٥٨)و (ئەحمەدی حەمە مـەلا ١٩١٣ـ١٩٦٩)ی هونەرمـەند ، مەقامی خـۆش و دڵکێش و هەندێ جاریش بە دوو قۆڵی لەگەڵ (میخەی یوسفی هەرمۆتەیی)دا ( بەیتی مەم و زین ) و ( ناسرو ماڵ ماڵ ) یان بە ( شێوە موکـریانییەکەیان ) دەگوت . ئاوای لێ هات لەو شارەدا بوو بە میرات گری لێ هاتووی (حەنیل)و (نەشئەتی رەشید ئاغا)و (مەربێن) لە هونەری مەقامی کوردیداو ، هیچ کۆڕو ئاهەنگێکی ئەوشارە بەبێ دەنگی (سێوە)و مەقامە خۆشـەکانی سێوە ، شەوق و شادی تێدا نە دەگەڕاو ، مەستی هونەریی هونەر پەروەرانی پێمەسـت و مەدهوش نەدەبوو ، هیچ شایی و ئاهەنگی نەورۆزو سەیرانی بەهارانیش بە بێ ئاوازی گۆرانی (جەبارەوە جەبارە) و (شلەو خانان)ی خاڵە سێوەی هونەر ـ مەندمان ، هەوای عیشق و دڵداری نە دەخستە کەللەی سەر چۆپی کێشی سەر گەرمی ئەڤینی یارە نازدارەکەی و مەستی خۆشیی بەهەشتی گولزاری بەهاری نیشتمانە خۆشەویستەکەی .

بەم جۆرە (سێوە) لەو شارە خنجیلانەی کـورددا ، لە دەرگەیێـکی فراوانەوە چووە ناو مەیدانی هونەری ئاوازو گـۆرانی کـوردییەوەو ، وەستایانەو لەسەرەخۆ چووە پێشەوە ، تا هونەرمەندیی خۆی و ڕەسەنایەتی ئاوازو مەقامەکانی بە هەموو خەڵکی ئەو شارەو سەرتاپای کوردسـتان ناساندووە .

---

(١) ئەم زانیارییەم لە کاك شمعوونی خواجە یوسفی کۆیی وەرگرتووە ، کە لە ساڵی ١٩٠٤ لە کۆیە لە دایك بووەو ، لە ژیاندا ماوە .

# چاوپێداخشاندنێکی خێرا بە تۆماری ژیانی سێوەی هونەرمەند

سێوەی مەقامبێژی هونەرمەندی کوردمان ، ناوی تەواوی (صلیوە)ی[1] کوڕی خواجە (یەلدە)ی کوڕی (صلیوە)یە ، لە ساڵی ۱۸۹۱ دا لەشارەکەی کۆیە هاتۆتە دنیاوەو چاوی ژیانی بە جوانیی باخ‌و سەیرانگاکانی هەرمۆتەو ئاشان‌و ئۆمەرخوچان کراوەتەوەو گوێی بە ئاوازی سوێسکەو کەوی قەد پاڵی چیای باواجی‌و هەیبە سوڵتان‌و چریکەی بولبولانی شیوە رەزانی گۆش بووە ٠



سێوەی هونەرمەند لە ساڵی ۱۹٦۲ دا

سێوە لە ساڵی ۱۹۰۲دا بۆ یەکەم جار لەلای (قەشە حەننا) خراوەتە بەر

---

(۱) ناوی(صلیو)ە لە ناو دیانەکانی کۆیەو هەرمۆتە بۆ خۆشەویستی‌و کورت کردنەوە دەکرێ بە (سێوە)٠

خـوێندن‌و لـه ســاڵه‌كانی (١٩٠٣ ـ ١٩٠٤) یشدا دەرسی زمانی كلدانی‌و بنچینه‌كانی ئاینی خریستیان (مه‌سیحی)ی لەلای (قه‌شه گۆرگیسی ره‌به‌ن) خوێندووه‌و له ساڵی ١٩٠٥ دا به ماوەی دوو ساڵ لای ( قه‌شــه پۆڵسی عوجمایا)ی‌ناودار به‌(قه‌شه سووره) خوێندنه‌كه‌ی ته‌واوكردوه ، لـه بـه‌ر زیره‌كی‌و زه‌ین روونی بـه مـاوەی پێنـج ســاڵ بـه چـــاكی زمانی كلـدانی‌و ســـه‌ره‌تایێك لـه زمانی فه‌ره‌نـسی فێر ده‌بێ‌و له خوێندنه‌كه‌یدا ده‌گاته پله‌ی « شه‌ماشه »و ، له لاوه‌ش به یارمه‌تی هه‌ندێ له دۆســـــته خوێنده‌واره‌كانی به باشی فێری خوێندنه‌وه‌و نووسینی كــوردی‌و عاره‌بی‌و فارسی ده‌بێ‌و ئاگادارێیكی باش له شیعری كوردی‌و عاره‌بی‌و فارسی په‌یدا ده‌كات ، بۆیه به ده‌یان جامه‌و هۆنراوه‌ی كـــوردی‌و فارسی له‌به‌ربوون‌و به مه‌قام‌و به‌سته ده‌ی‌گوتن ، وه‌ك شیعره‌كانی ( قاصد )و ( ئه‌خته‌ر)و (حاجی قادری كۆیی)و ( وه‌فایی )و ( عه‌بدوڵلا به‌گی مصباح الدیوان ) و [ صافی ]و ( دڵدار ) ٠

له ساڵی ١٩٠٣ دا خواجه (یه‌لده) ی باوكی به نه‌خۆشی‌ی ڕشـانه‌وه ( كۆلێرا ) كۆچی دوایی ده‌كات‌و ، سێوه‌ی ده‌سته كوڕێش بۆ گـوزه‌ران‌و به‌ڕێوه‌چوون ده‌بێته شاگردی (خواجه یوسف)ی مووڕێس‌و جۆلای دۆستی نزیك‌و دڵسۆزی باوكی‌و ، له ماڵه‌وه له گه‌ڵیاندا ده‌ژی ، كه ده‌گاته ته‌مه‌نی هه‌رزه‌كاریی ، ده‌كه‌وێته داوی دڵداریی كچه جوان‌و نه‌شمیلانه‌كه‌ی وه‌ستاكه‌ی كه ناوی (وارێ)[1] بووه ، ئه‌و ئه‌ڤینداری‌یه‌شی له‌گه‌ڵ (وارێ)ی ناسك‌و نازداردا ، بووه به مایه‌ی ته‌قینه‌وه‌ی به‌هره‌ی هونه‌ری مه‌قامبێژی یه‌كه‌ی ، به تایبه‌تی كه هه‌ستی كردووه (وارێ)ی دڵڕفێنیشی ئه‌و حه‌زو دڵداری‌یه‌ی له‌گه‌ڵدا ئاڵوگۆڕ ده‌كات بۆیه به‌شه‌وو به رۆژ گــۆرانی دڵداری له ده‌مدا نه‌بڕاوه‌و سه‌رتاپای ئاوازی گۆرانی‌یه‌كانی هه‌ر سۆزو عیشقه تــه‌مره‌كه‌ی

---

( ١ ) وارێ كورت كراوه‌ی ناوی (وارینه)یه ٠

بووه بۆ یاره خۆشەویستەکەی[1] ، کەچی لە ئەنجامیشدا . کە وەستاکەی هەستی بەوە کردووە ، کچەکەی پێنەداوەو ، نەی هێشتووە بۆ یەکتری بن،و داویە بە ( صلێوەی قەشە ئەلیاس)ی خزمی خۆیو دوای کەمتر لە ساڵێك (واریێ)ی ئاشقی دڵ سووتاو بەدەردی وەرەم (سیل) سەردەنێتەوەو . سێوەی بەد بەختیش دوای چەندساڵێك کچێکی خزمی خۆی بەنا بە دڵی پێدراوە[2].

سێوە لە کاتی گەنجێتیدا ، بۆ گوزەرانو ماڵ بەرێوەبردن پشتی بە پیشەی موو ڕێسیو جۆلایی بەستووەو ، لە دواییدا لە کڵێسا بچووکەکەی کۆیەدا بووە بە (شەماشە)و ، بە زۆری بەرێوەبردنی ئەو کڵێسایە هەر لە ئەستۆی ئەو بووەو[3] ، لە هەمان کاتیشدا دەبوو بە نووسەرو مسرزاو حیسابگری بازرگانو خاوەن زەویو زارو تووتن چینەکانی کۆیە[4] .

سێوە پیاوێکی کەڵەگەتی مەیلەو قەڵەوی چاو گەورەی لووت خڕو ، زۆر دڵتەڕو زەوقانیو نوکتەزانو قسەخۆشو وەرام لەدەست بوو · زۆر حەزی لە کۆڕو دانیشتنەکانی خواردنەوە دەکردو بە زۆری دۆستو برادەرو هاو ـ نشینەکانی ژیانی لە دەستەی گەنجو جاحێڵەکانی شارەکەی بوو ، نەی ـ دەویست پێی بگوترێ : پیر بوویی ، بۆیە هەستانو دانیشتنی لەگەڵ ئەوەی نوێو ئەهلی زەوق دابووەو ، ئەوەندەی هاوەشرەبی دۆستە لاوەکانی وەك (تایەر تۆفیق باکووریو ئارتینی بەرگدرووو حەوێز عەبدولوەهابو سابیر عەبدوڵڵا جەراحو محەمەد عەلی مستەفا و عەبدولواحید سەعید) بوو ، ئەوەندە هاونشینی دۆستە هاوتەمەنەکانی خۆی نەبووە · هەردەم سەرچۆپی

(١) گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە (٤٧)ی ساڵی ١٩٧٨ ، ل٦١ ، باسێك لە سەر سێوە ·

(٢) ئەم زانیاریەم لە کاك (حەننا سلێمان ١٩٠٨)ی هەرمۆتەیی وەرگرتووە

(٣) یادداشتە هونەرییەکانی (باکووری) ، ل٥٤ ، (دەستنووس) ·

(٤) گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە (٤٧)ی ساڵی ١٩٧٨ ، ل ٦١ ·



سێوە لە ساڵی ١٩٦٢ دا لەگەڵ دەستەیێک لەدۆستەلاوەکانیدا

کێشی شایی رۆینەی کوردیو مەقامبێژی شایی‌و ئاهـــەنگەکانی نەورۆزو سەیرانەکانی شارەکەی بووە ، هەر ئاهەنگێکی سێوە بەشداریی تێدا نەکردبێ وەك بەهارێکی بێ‌گوڵ بووەو ، تامو خۆشی لێ وەرنەگیراوە . بەم جۆرە سێوەی هونەرمەند تا دوا هەناسەی لە ژیانی‌دا هەر لە خزمەتی هـــونەری مەقامو گۆرانی کوردی‌دا بووە ، تا لە رۆژێکی ساردی مانگی کانوونی دووەمی ١٩٦٤ داو لە تەمەنی ٧٣ ساڵی‌دا ، لە کۆیە ماڵ ئاوایی لە هونەری کوردی‌و لـــە دۆستو یارانی کردو ، هەر ئەو رۆژە تەرمەکەی بە شانو بازووی دۆستو هونەر پەروەرانی ئەو شارە براوە بۆ گۆڕستانی «هەرمۆتە»و لەوێ بـــە خاکی نیشتمانەکەی سپێردراوەو مەیدانی هونەری ئاوازو گۆرانی ڕەسەنی کوردی بۆ هونەرمەندە لاوەکان چۆڵ کردووەو کوڕو کچێکی لە پاش بەجێماوە (پۆلص)ی کوڕی کە ئێستا لە بەغدا دادەنیشێ‌و (ئەنیسە) ی‌کچی کە لـــە

گوندی (هەرمۆتە)دا دەژی‌و هەردووکیان لە ژیاندا ماون‌و کەوتوونەتە ناو سالآنەوە ·

## سێوەی هونەرمەند لەکاروانی گۆرانی ی کوردیدا

سێوە لە سەردەمی گەنجێتی‌دا ، هونەرەکەی لە چوار چێوەی دیوەخان‌و کۆڕو دانیشتنی دۆست‌و یارانی نە دەچووە دەرەوە ، تاکو چلەکان ، لەگەلٓ هەلٓچوونی هەستی نیشتمان پەروەریی میللەت ، ئینجا هونەرەکەی کەوتە سەرشانۆی ئاهەنگەکانی نەورۆزی کوردو دەنگی دایەوەو سەرلەنوو گۆرانی (جەبارە)و (شلەو خانان)ی شایی رۆینەی زیندوو کودەوەو ، گۆرانی [ لەبەر نازی چاوبازان ]ی وەفایی کرد بە مەقامی تایبەت بە بووك گواستنەوەو [مەقامی بەقامەت خەرامان]ی صافی هیرانی‌و [ زولف‌و ئەگریجەی یار ]ی یونس دلٓداری شاعیری نیشتمان پەروەری کرد بە گۆرانی بە ڕەواجی ناو کۆمەلٓی هونەر پەروەرانی ئەو شارەی کۆیە ·

سێوە لە سالٓی ۱۹۵۲ دا[(۱)] پێنج مەقامی لە مەقامە رەسەنەکانی خۆی لە ئێستگەی رادیۆی عیراق ـ بەشی کوردی دا تۆمار کردوە کە ئەمانەن :ـ [ عەجەم : سەحەر] و [حیجاز : گورلٓ] و (بەیات : عایشە گولٓ ) و (حیجاز : بەهار ) لەگەلٓ مەقامی (شەنگ مێرەم) دا ، لەمانە مەقامی پێنجەمیان نەبێ ، دەنا ئەوانی دیکە ناو بەناو لە ئیستگەی رادیۆی کوردی‌یەوە پێشکەش دەکرێن[( ۲ )] ·

لەسەرەتای سالٓی ۱۹۵۸دا ، کە ( کۆمەلٓی بووژاندنەوەی هونەرە جوانە

---

( ۱ ) بنوارە گۆڤاری (أهل النفط)ی ژمارە (۱۵) سالٓی [۲] تشرین. یەکەمی ۱۹۵۲ ·

( ۲ ) گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە (٤۷)ی سالٓی ۱۹۷۸ ، ل ٦۱ ·



**سێوه لەناو ستۆدیوی ئیستگەی عیراق ـ بەشی کوردی لە مانگی نیسان ۱۹۵۲دا لە کاتی تۆمار کردنی مەقامەکانی بە یارمەتی ئاوازی مۆسیقاژەنەکانی ئەوسای ئیستگە**

**احمد الخلیل بە عود ، ئایڤن بهنام بەنای ، قادر دیلان**

**بە کلارنێت ، ابراهیم محمد بە جومبوش‌و**

**ناظم نعیم بە کەمان‌و عبدالاحد جرجیس بەقانون**

کان) لە کۆیە دامەزرا (سێوه) بە ئەندامی فەخریی ئەو کۆمەڵەیە وەرگیراو ، جموجووڵی هونەریی خۆی بە پێشکەش کردنی مەقامی رەسەنی کوردی لە شارەکانی (کۆیەو سلێمانی و رانیەو هـەولێر)دا نوواندو لە هـەموولایەکدا دەنگی دایەوە .

له هاوینه‌کانی ۱۹۵۸ و ۱۹۵۹ دا ، (سێوه) و (باکـــووری) به ناوی کۆمه‌ڵه‌ی بووژاندنه‌وه‌ی هونه‌ره جوانه‌کانی کۆیه‌وه ، له لایه‌ن [ کۆمــــه‌ڵی هونه‌ره‌جوانه‌کان ]ی‌سلێمانی و ( تیپی مۆسیقای مه‌وله‌وی) بانگ کراون بۆ به‌شداریی کردن له ئاهه‌نگه‌کانی ئه‌و کۆمه‌ڵه‌و تیپه مۆســیقی‌یه ، (سێوه)ی هونه‌رمه‌ند به یارمه‌تی مۆسیقای هونه‌رمــــه‌ندان ( قادر دیلان) و [ ولیه‌م یوحه‌ننا]و ( نه‌جاتی عه‌بده)و ( باکووری) مه‌قامه خۆشه‌کانی خۆی به هه‌موو هونه‌ر په‌روه‌رێکی ئه‌و شاره‌ی سلێمانی ناساندووه‌و ، هه‌موو جارێ خه‌ڵکێکی زۆر له پیاوه به‌ته‌مه‌نه‌کانی ئه‌و شاره هاتوون بۆ گوێ گرتن له مه‌قامه‌کانی‌و گوتوویانه خاوه‌نی ئه‌م ده‌نگه خۆشه میرات گری « ئه‌حه‌ی ناسرو سه‌ید عه‌لی ئه‌سغه‌رو مه‌لاکه‌ریم»ه ٠

کاتێ که شه‌ویش درەنگ داهاتووه ، خه‌ڵکه‌که له باغچــــه‌ی یانه‌ی فه‌رمانبه‌رانی ئه‌و شاره‌دا ، به ئاوازی مه‌قامه‌کانی ( ســــێوه )و قه‌تارو ئه‌ڵلاوه‌یسی ( ره‌شۆل عه‌بدوڵلا ) رۆژیا نکردۆته‌وه (۱) ٠

له ساڵی ۱۹٦٠ یشدا ، دوای هه‌فته‌یه‌ك ئاهه‌نگ گێران له ســــلێمانی له‌گه‌ڵ باکوری‌و قادر دیلان‌و ئه‌ندامانی کۆمه‌ڵی هونه‌ره جوانه‌کانی سلێمانی له پاسێکی گه‌وره‌دا ، به‌ره‌وشاری هه‌ولێر هاتوون‌و ، له رێگادا هــــه‌ر له سلێمانی‌یه‌وه تاکو ده‌گه‌نه هه‌ولێر (سێوه) بۆ پرۆفه‌کردنی ئاهه‌نگی شــاری هه‌ولێر ، له‌سه‌ر ئاوازی که‌مانچه‌ی (قادر دیلان)ی هونه‌رمه‌ند ، مه‌قامی هه‌مه جۆری کوردی گوتووه‌و ، له هه‌ولێریش بۆ ماوه‌ی دوو شه‌و لــــه هۆڵی گه‌لدا به سه‌رکه‌وتوویی ئاهه‌نگی مۆسیقای سلێمانی‌و مه‌قامه‌کانی (سێوه)ی هونه‌رمه‌ندی کورد ، له‌و شاره مێژوویی‌یه‌دا پێشکه‌ش کراون ٠

(۱) یادداشته هونه‌ری‌یه‌کانی (باکووری) ، ل٥٥ ، ده‌ستنووس ٠

# چالاکی یە هونەری یەکانی سێوە لە کلێسای کۆیەدا

شەماشە سێوەی هونەرمەند لە کلێسا بچووکەکەی کۆیەدا ، شوێنێکی تایبەتی دیاری هەبوو لە هەڵسووڕاندنی کارو باری ئایینیی دیانەکانی ئەوشارە · لەکاتی نوێژکردنو قودداسەکاندا ، هەر دەنگو ئاوازەکانی ئەو بوون لە گوێی نوێژکەراند دەزرنگانەوە · خەڵکەکە تامو چێژێکی زۆریان لە تەوشیحو مەزموورو گۆرانییە ئایینییەکانی وەردەگرت ، کە هەموو ئێوارە ـ یەکی یەك شەمووانو لە جەژنو موناسەبەتە ئایینییەکانیاندا بە دەنگە پڕجۆشو خرۆشەکەیەوە دەیگوتنو دنیای دەهێنایە جووڵەو هەژانو ، خەڵکەکەی دەبردە دنیاییکی دیکەو دەی فڕاندن بۆ ئاسمانێکی پڕ لە ڕۆشناییو گیانی پاکی پێغەمبەرو پیاوچاکان · هەندێ لەو برا دیانانەی کە لەو کلێسایەی کۆیە لەگەڵ سێوەدا نوێژیان کردووە ، دەگێڕنەوەو دەڵێن (١) :ـ

یەکێك لە هەرە بە ناو بانگترین گۆرانییە ئایینییەکانی کە لە موناسە ـ بەتی تایبەتی دەیگوتن ، گۆرانییەك بوو بە ناونیشانی [ نقوم شەپیر ]بوو ، کە ماناکەی بە کوردی ئەمە دەگەیێنێ :ـ [ با هەستین تەسبیحات بۆ خودا بکەین] و لە سەر ئاوازی مەقامی حیجاز و لەسەر شێوەی مەقامی [ بەهار ]ی دەگوت ، بەجۆرێکیوا کە شارەزا ترین کەس لە هونەری مەقامات نە توانێ وەکوو ئەوی بڵێو ، نە دەزانرا چۆن دەستی پێدەکردو ، چۆنیش کۆتایی بەو ئاوازە خەمناکە دەهێنا !! بەو دەنگە پڕ سۆزەی نوێژ کەرەکانی ناو کلێسای بە جارێ دەهێنایە جۆشی گریانو فرمێسکی لە چاواندا نە دەهێشتن ·

---

(١) یەك لە وانە : دۆستی خۆشەویستم ئەندریۆس باکووری ئەم هەواڵانەی بە وردی بۆگێڕامەوەو هەر بەم جۆرەشی لەناو یادداشتە هونەرییەکانیدا تۆمار کردووە ·

ئەو گۆرانی‌یەی [ نقوم شەبێ ] تایبەت بوو بە رۆژی [هەینی ئەشکەنجەو ئازار ] کە بیرەوەریی رۆژی لە سێدارەدانی حەزرەتی عیسایەو دەکەوێتــە دوو رۆژ پێش جەژنی هەستانەوەی حەزرەتی مەسیح کە هەموو ساڵێ لــە رۆژێکی یەك شەممەدا ، لە مانگی نیسان بە پێی حیسابێکی تایبەتی کڵێســا ئەو جەژنە دەکرێ ٠

بەم جۆرە سێوە لەناو کڵێساو لەکاتی جێبەجێ کردنی نەریتی ئایینی خۆشیاندا هەر ئاوازی کوردی بەکارهێناوەو تەوشیحی ئایینیو مەزموورەکانی (حەزرەتی داود) یهەر بەو ئاوازانە دەگوت کە لە کۆڕو ئەنجومەنی تایبەتیو لە ئاهەنگی شاییو خۆشیدا گۆرانی‌یەکانی (عایشەگوڵ)و (ســەحەر)و [نیوەشەو]و (بەهار)و [پاییز]و (شەنگ مێرەم)ی پێ دەگوتن ٠

ئەوەی راستیش بێ ، برا دیانەکانی کۆیەو گوندی هەرمۆتە ، لە چەند گۆرانیو تەوشــیحێکی ئایینی بــەولاوە کــە بەشــێکن لــە نەریتی دووعاو نوێژیان ، بەزمانی سریانی دەگوترێن دەنا لە هەموو موناسەبەتێکی خۆشیو ناخۆشی ئەو کۆمەڵە ، چ لە ئاهەنگی خەنە بەندانو بووك گواستنەوەو بەزمی شەوارەو ، چ لە بەندو سەردوولکەی تازیەی مردوواندا ، هەر گۆرانی کوردی‌یان گوتووەو لە لایان نەبۆتە شتێکی باو بە زمانە ئایینی‌یەکەی خۆیان گۆرانی بڵێن(١) ٠

---

(١) ئەم زانیاریو راستی‌یەم لەساڵی ١٩٧٧ و لە سەرەتای مانگی شوباتی ١٩٧٩دا لەم برادیانانەی کۆیەم وەرگرتووە :ــ

(أ) مەربێنی قەشە گۆرگیس کۆیە ١٨٩٢ ــ ئابی ١٩٧٩ ٠

(ب) سەڵمان پەلدە (سەڵمانەسوور) کۆیە = (١٨٩٥ ــ ١٩٧٧) ٠

(ج) گۆرگیسی خواجە یوسف کۆیە ١٨٩٨ ٠

(د) حەننا عەبدولکەریم (حەنەکە) کۆیە ١٩٠٠ ٠



له بواری ئەم لێدوانەشماندا دەبێ ئەوە بڵێین :ـ کە لەو کاتەی گۆرانی ـ بێژە دیانەکانی ئەو مەڵبەندە بۆجێ بەجێ کـــردنی نەریتی دووعاو نوێژی کڵێسایان سوودیان لە ئاوازی کوردی وەرگرتوە لەهەمان کاتیشدا نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە مەقامی کوردی لەناو ئاوازی مۆسیقاو ئیقاعی | ناقووس‌و تاس‌مەعرف‌او دەنگی گەڕەنای قوودداسەکانی ناو دێرو کڵێساکاندا لووس‌و لێکترو پاك‌و پوختر بوون‌و ، باشتر زاخاو دراون‌و ، بەڵگەی ئەم بۆ چوونەشم، ئەو ئاوازە تایبەتی‌یانەی (سێوە)ی هونەرمەندمانن کە لەسەردەمی ئـەو ، لەو بەدەر هیچ هونەرمەندێکی دیکەی کورد پێی نەگوتراون وەکو ئەو گوتوونی‌و لێی سەرنەکەوتوون وەك ئەو لێی سەرکەوتووە .

## گەشتێك بەناو دەقی ئەدەبی مەقام و گۆرانی یەکانی سێوەی هونەرمەندا

سێوەی گۆرانی بێژی هونەرمەند لە ماوەی ژیانی‌ی هونەری‌دا بە دەیان مەقام‌و گۆرانی‌ی کوردی بە شێوە تایبەتی‌یەکەی خۆی گوتووەو ، ئەوەی من تۆمارم کردبێ (١٤) مەقام‌و گۆرانی کوردین . هەندێکیانی لە گەنجینـــەی ئەدەبی فۆلکلۆریی کوردی وەرگرتووەو هەندێکیشیانی شیعری شـــاعیرە کلاسیکی‌یە ناودارەکانی کوردن . بەکامی دڵ بەناو باخ‌و گوڵزاری ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی کەوتووەو چۆتە ناو لالەزاری شیعری پتەوی کلاسیکیمان‌و کام گوڵ‌و لالەی جوان‌و ئاودار بووبێ چنیویەتی‌و کردوونی بە چەپکێ ئاوازو گۆرانی‌ی رەسەنی نەتەوەکەی‌و وەك دیاری‌یەکی بەهادارو هێژا پێشکەش بە

---

(هـ) شمعوونی خواجە یووسف (شموون) کۆیە ١٩٠٤ .

(و) حەننا سلێمان (حەنۆی‌سێمانی) هەرمۆتە ١٩٠٨ .

(ز) شەمعیەی مەربێنی قەشە کۆیە : ١٩١٤ .

ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردی کردووە ·

بانیمەش لێرەودوا ئەو گوڵە جوانو بۆنخۆشانەی یەك یەك وەربگرینو بەکامی دڵ تێربۆنو تێر جوانی ببین ·

**(١) مەقامی گوری (گوڵێ)** :ـ مەقامێکی حیجازی کوردی‌یە ، لەسەر زمانی لاوێکی ئاشقی (گوڕلێ) ناوێك یا کچێکی جوانی وەکوو گوڵ گوتراوە · مەقامێکی جوار بەندی‌یەو دەتکدانەوەی زیانیکی شارستانی‌ی سەدەکانی بیشووی کوردستانەو ئەمەش دەقە ئەدەبی‌یەکەیەتی : ـ



**سێوە لە شاری سلێمانی لە سەر ئاوازی مۆسیقای (ولیەم یۆحەننا) بە کەمانچە و (حازم حەدداد) بە قانون مەقامەکانی پێشکەش دەکات**

# گورێ

ئەرێ گورێ گورە جوانێ
سینگ سپیی مەمك فنجانێ
داك حدوودێ باب شاسەیوانێ
خـواکەی گورێ
ئەگەر جەللادان لە من دەگرن چار گۆشەی مەیدانێ
چەرخەچی[1] شامیـسریان[2] دەردێنن لە کالانێ
تو عەشقی خودای بەوی رۆژی جومعەیە
شـەمووی بە سـەر دادێ
ئەوان گرتیان بەردەوە لە بەندیخانێ ٠
گوری لە باغانم نەمایی
خۆشی لە ساران دەست لە من بەردای



ئەرێ گوری ئەمان گور لە خەوێ هەردەستی
شەنگ‌و شۆڕێ ، بە ژن برندێ پشتی دەبەستی !
ئەرێ برادەرینە ئەگەر هەنیبێ[3] گورە جوانێ
لە بۆ من بمینێ بەوێ مانگی لە چاردەی
کە وەتانی لە مابەینی هەورو ساماری

---

(١) چەرخەچی : دەورییە ، زەلامێکە کـە بۆ پاراستنی ئاســـــایش بسووڕێتەوە [ فەرهەنگی خاڵ] جـ٢ ، ل٣٥ ٠

(٢) شامیـسری : جۆرە شـمشێرێکی جەوهەرداربووە ، لەمیسر دروست کراوە ٠

(٣) هەنیی : نێوچەوان [بڕوانە فەرهەنگی مەهاباد ، ل٦٩٥ ] ٠

جۆخین دەبەستی ٠
داد گوڕێ لە باغانم نەمایی
خۆشی لە ساران دەست لە من بەردای ٠

★ ★

ئەری گوڕێ گورە رەندی( ١ )
مل بە عەباسی( ٢ ) ، سەر بەسێ شایی( ٣ ) کەونینە
قۆڵ بەبازیبەندی( ٤ )
ئەرێ برادەرینە هەر کەسانەکی
قسەکی لە مابەینی منو گورە جوانی بکاتن
پارەیی حاری بە حاری کوڕی پاشای یەمەنێ بی( ٥ )
کە وەتانی بە قسەی (بەکرەی میرگەوەری)
کەوتیتەوە حەپسو لە گەڵ هەرامە بەندی
داد گوری لە باغانم نەمایی
خۆشی لە ساران دەست لە من بەردای ٠

★ ★

ئەرێ گوڕێ ئامان گور ئەسمەرێ

---

١ رەند : روو خۆش ، قسە خۆش
٢ عەباسی : جۆرە دراوێکی ئێرانی سەردەمی شاعەباسی صەفەوی بووە٠
٣ سێشایی : جۆرە دراوێکی دیکەی ئێران بووە ٠
٤ بازیبەند : دووعاو نوشتەیەکە لە قۆڵو بازوو دەبەسترێ ٠
٥ یەمەن : لێرەدا مەبەستی لەیەمەن شارێکی کوردستانی سەروو بووە ، کە لە رۆژ هەڵاتی خاکی بۆتان بووە و ئێستا ئەو شارە نەماوە ٠

کەزی زەرێ (١) ، چاو سەقەرێ
تو خواکەی سەرت بێنە دەرێ
لە تاقان لە پەنجەران لە شانشینان لە چار کناران
بە کەرتت کردن جگەرێ ٠
ئەرێ برادەرینە
ئەمن هەرچەندی حەکیمو لوقمانم هالبوونە سەرێ
هەموو حەکیمو لوقمانان دەرێن ٠
بریندارى گورێیەو پێی نابەین زەفەرێ !!
داد گورێ لە باغانم نامایی
خۆشی لە ساران دەست لە من بەردای !

**(٢) عایشە گور :ـ ئەم گۆرانی‌یە لەسەر ئاوازی مەقامی بەیات دەگوترێ**

لە سەر زمانی کچێکی ئاشقی لاوێکی دڵدار گوتراوە ، بە رای من ئەم مەقامە وەڵامدانەوەی مەقامی (گورلێ) یە ، بە هەردوو دەقەکە داستانێکی ئەڤینو وەفاداریی کوردی پێك دێنن ٠

لە بارەی ئەم مەقامەی (عایشە گوڵ) ەوە ، هەندێ هەواڵو حیکایەتی وا هەیە کە لە زۆر ناوچەی هەولێردا بڵاونو خۆم لە چەند کەسێکی هەوار جیاوازم بیستووەو دەڵێن (٢) :ـ « گوایە ئەو عایشە گوڵە بووکی پەردەی

---

(١) کەزی زەر : کەزی زەرد ، لە سەر شێوەی بۆتانو بادینان ٠

(٢) لەو کەسانە :

١ ـ رۆستەم حەوێزیی شاعیر [کۆیە : ١٩١٣]کە ئەویش لەباوکی بیستووە ٠

٢ ـ وەستا مەولوودی حوسێن رەمەزانی بۆریچی [گوندی میرغوزارە : ١٩٣٢] کە ئێستا لە هەولێر دادەنیشێو لە کاتی خۆی لە کوێخا عوسمانی داڵداغانی بیستووە ٠

سەعید بەگی برازای میر سولەیمان بەگی میری سۆران بووە ، سەعید بەك بەر لەوەی بچێتە پەردەوە ، بە فەرمانێکی بە پەلەی میر سولەیمان ، لەگەڵ دەستە سوارێك بە وەفد دەنێردرێتە (ئەستەمبوڵ) بۆ دیدەنی سـولتانی عوسمانلی ، تا دەگەڕێتەوە (عایشە گوڵ) ئەون هەڵ دەخاو مافوورێکی چواردە گوڵی دەچنێ و لە چنینی هەر گوڵەی‌دا بەندێکی ئەو مەقامە هەڵ دەبەستێ ، جا لێرەدا دەقی ئەو مەقامەمان زادەی شاعیریەتی (عایشە گوڵ) خۆی بووبێ !! یان بەرهەمی شاعیرێکی دیکەی کـورد بێ و بە زمانی ئەوی دانابێ ، تا گەیشتۆتە سەردەمی (حەنیل)و (سێوە) تەنیا چوار بەندی لێ‌ماوەتەوە ۰ بەو حیسـابەی (بەند) بەو بەشە مەقامە دەڵێن ؛ هاو قوفڵبن واتا (هاو قافیە)و کێشیشیان لە کورتەوە بۆ درێژ دەرواتو ئەمەش دەقی مەقامەکەیە :ـ

## عایشە گوڵ

ئای ئای ئای ئای
ئەگەر سەری من دەێشی
دری عایشێی بابان وێرانی نا سەکنی
لـە بەر هـەرامە زوکرتی (۱)
ئەگەر عایشە گور دەرێ
هەر کەسانەکی سوارە جووکەلانەکەی من ناناسی
ئەوەتانی قایمەو قایمەڵانی (۲) خۆی
داوێتەوە چۆم‌و چۆمارو سۆرەکرتی (۳)

---

(۱) زوکرتی پیاوی بێ ژن‌و ماڵ ۰

(۲) قایمە : هێزو قووەت ، قایمەڵان : جێگەو شوێنی خۆ قایم کردن ۰

(۳) کرتی : جۆرە دەوەنیکە لەدار گەز بچووکترە لەرۆخ‌چەم و لەدێمەکاریش دەڕوێ ۰

ئەگەر عایشەگور دەرێ
هەرکەسانەکی سوارە چووکەلانەکەی من ناناسی
ئەوەتانی سواری جوانی‌یە ماینەکی
بۆری ئەسعەد بەگی‌ی کەوێتە
لە لایەکی دەڕۆن جووتەکی توولەو لەوی دیکەشی
جووتە تاژی مل بە قەرێتە !!



گەلی برادەرینە ئەمن ئەستێرەکم لێ هەراتیە
لە لایێ رۆژهەراتی
قەت لەدری من ئاوا نابی
ئەگەر عایشەگور دەرێ :ـ
ئەمن هەرچەندی چاوی خۆم دەگێڕم
لە دوو سوارە چووکەلانەکەی من
بزربویتەوەو پەیدا نابی
گەلی برادەرینە ئەمن چاکوەیە
دوگمەی سینەو مەمکی خۆمی مار وێرانی بترازێنم
داخوا دەرێم بەلکی سوارە چووکەلانەکەی من
زیزبووەو قەت ئاشت نابی ؟!



ئەرێ غەمگینی‌و غەم لەبەر عایشە گورێ
بابان وێران‌و قەلەندەری
سراقەت کەسم نەمابوو

لەبۆ سوارە چووکەلانەکەی من هەر بە هیچی
گەلی برادەرینە ، ئەگەر سەری من دەێشی
دری عایشێ بابان وێرانێ نا سەکنی
لەبەر میراتە هەرامە زوگرتی
ئەگەر عایشە گور دەرێ
هەر کەسانەکی سوارەکەی من نەدیتیەو نەناسی
ئەوەتانی قایمەو قالانی خۆی
داوێتە چۆم و چۆمەلادەو سۆرەکرتی
بەرێ صەد حەیفو موخابن
دەمکوژیتن لەوێ کۆنە دنیایێ هەر بەهیچی !
ئای ئای ئای ئای ٠

**(٣) مەقامی سەحەر :ـ**

گۆرانی‌یەکە لەسەر ئاوازی مەقامی عەجەم دەگوترێ ٠ مەقامێکی شارستانی‌یەو لە ژیانو هاتوباتی ناو شارو بازرگانیتی سەردەمێکی زوو دەکات ٠ دانەری دەقی مەقامەکە تا رادەیەك رۆشنبیربووەو ، ئاگاداری کەلەپووری ئیسلامەتی‌و نەتەوایەتی کورد بووە ٠ تابلۆی شیعری جوانو وێنەی هونەریی ناسکی تێدا کێشراوە ، با بزانین چی تێدا هاتووە :

**سەحەر**

ئەوەل سەحەرە
سەحەر سەدای منی غەریبە ماری
وەزی هەر گێژم
ئەگەر فەقێیان لە مەدرەسان دەخوێنن

ئەمن بەبێ برین خوێنێ دەرێژم
گەلی برادەرینە ئەمن هەرچەندی دەکەم
لەوێ کۆنە دنیایێ
قاصیدەکی بە متمانیم بە دەست ناکەوی
بینێرمە کن بەژنێ باریكو دووچاوی بەرەك
راستی درێ خۆمی لەبۆ ببێژم
وەیلێ سەحەرە !!



ئەوەل سەحەرە
دەرکیوان شانشینان[1]! دوو دەرییان [2]
پەنجەرەو حەسارگان هەرەنگێون
تاکوو چارێگە سەعاتەکی لێی بێتن عەکسی بخوورێ
ئەگەر شەمس موغابرا
چرا دادەگیرسێتن لە سێبارەکی نوورێ
گەلی برادەرنیە
ئەمن دەست لەسەر بەژنی باریكو
دوو چاوی بەرەك هەڵ ناگرم
هەتا حەزرەتی ئیسرافیل[3] نەداتن لە نەفخی سوورێ[4]

---

(١) شانشین : ئەوکۆشکەیە کە(شا) لێی دادەنیشێ یاخود هەرکۆشکێکی گەورە ٠

(٢) دوو دەری : لێرەدا مەبەستی لەو کۆشکانەیە کەدوو دەرگایان هەبێ ٠

(٣) ئیسرافیل : فریشتەیێکیخودایە ٠

(٤) نیشانەیە بۆ ئەو ئایەتەی قورئان کە دەڵێ [ يوم ينفخ في الصور فتاتون افواجا] « بڕوانە قورئانی پیرۆز ، سوورەتی (النبأ) ئایەتی ١٨» ٠

مەنــووری هەلاج[(١)] تەقەی دێ لە کەوانی [(٢)]
حەزرەتی مووسا زارویەك کەلیمەی دەکاتن
لەگەل باری تەعالا لە سەر کێوی تووری[(٣)] .
وەیلێ سەحەرە !



ئەوەل سەحەرە
گەلی برادەرینە ، دەرێن ئەورۆکە جومعەیە
لە مەحەلی نیوەرۆیێ
ئەگەر نەتێیان لە مەدرەسان دەخوێنن
بولبولی خانەوێران
بە جێ ناهێلێ جێ راوگەی خوێێ
گەلی برادەرینە ئەمن ئێستا دەرێم :
خوزیا دوو راموو‌سانان
لە بەژنێ باریك‌و گەردەنی زەردو
دووچاوی بەرەك کردبایە
لە مابەینی برژانگ‌و بروێێ !!
وەیلێ سەحەرە !



---

(١) هەللاج : زانایێکی صوفی هــەرە گەورەی ئیسلام‌بووە .
(٢) کەوان : مەبەستی لە کەوانی ژێداری پەڕەکردنە
(٣) توور : شارێکی بچووکە لەنیمچە دوورگەی سینا لە بن چیایێك کە بەناوی ئەو شارەوە ناونراوە .

ئەوەل سەحەرە
گەلی برادەرینە ، ئەمن ئەو سارەکە
سەهارەت بەژنێ باریکو دووچاوی بەرەك
بووم سەرگەردانە
ئەگەر لە شاری مووسلی
لە بۆ من بیتن هەتیمە سەرقافڵە باشی
بەرێ لە شاری بەغدایێ
لە بۆ من بیتن هەتیمە بازرگانە
وەیلی سەحەرە !

★ ★

ئەوەل سەحەرە
گەلی برادەرینە ئەگەر سینگی ئەو بابان وێرانەی
لەبۆ من بهێنێ بە وێ باغچە یسۆرە گوران
کە وەتانی ئەو سارەکە
بە خۆم لێ دەبم بە باغەوانە !
وەیلێ سەحەرە !

★ ★

ئەوەل سەحەرە
ئەمن ئەو سارەکە نیازی دری من وایە
لانکەکی لەبۆ ئەسمەرێ خۆم بکەم
لە داری سەوری (١)
ئەنگۆ لەبۆ من بانگ بکەنە

---

(١) داری سەور : داری سەوڵ ، کە مەجـــرەنی بەلەمی لێ دروســـت دەکرێ .

وەستایەکی دوانزدە عیلم
دەبا ئەو کراسی ئەو بابان ویرانەی
لەبۆ من بەقەدەر ببڕی
گەلی برادەرینە
ئەگەر مەمکێ مەحبووبە گچکەلانەکەی من
زێدە گچکەلانە بوون ناگاتە زاری تفری (١)
وەیلێ سەحەرە !!



ئەوەل سەحەرە
گەلی برادەرینە
ئەمن ئەو سارەکە نیازی دری من وایە ٠
لانکەکی لە بۆ ئەسمەری خۆم بکەم بەمسکینی
ئەگەر سۆرە گور سۆر دەبوون لە باغان
رەشە رەیحان سێبەری خۆی
داوێتەوە دەورەی پەرژینێ
گەلی برادەرینە ئەمن دوعایەکی دەکەم
ئەنگۆ برێن : « ئامین »
« هەر کەسانەکی ببێتە بامیزی دوو دران
یا رەبی خێر لەمارو مەنزلی خۆی نەبینی
رۆژی حەشری لە سەر بەردی سەخرە تولّایێ
روو دەرنەباتن لەبەر شەیتانی لەعینی
وەیلی سەحەرە !!

---

(١) تفر : طفل ، مندالّی ساوا ٠

**(٤) مەقامی بەهار :**

بەهار گۆرانی‌یەکە لە سەر ئاوازی مەقامی (حیجاز) دەگوترێ ٠ رەنگ و روویەکی دەشتەکی‌یانەی بەسەرەوەیە ، لە ناو قۆناغ و دیوەخـــانی ئاغاو میرانەوە گەشەی کردووە و بەم لاو ئەو لادا بڵاوبۆتەوە ٠ لە هەندێ بەشی‌دا دەور دابەش کردنێکی درامایی جوانی تێدایە ، با بزانین لە بەندەکانی ئەم مەقامە چیمان بە بەر گوێ دەکەوێ !

## بەهـــار

ئەمن بوهارەکم ئەوا گەیوەتێ
گەلی برادەرینە
خواکەی سەرێ من دەیێشی
دری منی غەریبە ماری دەترسی
ئەگەر سەرێ من دەبڕا ببیتن بە قوربانی
ئەوێ قورینگی[١] گەردن گوزر
کە وەتانی هەموو بوهارو پایزان
شاپەرێ خۆی شۆڕ دەکاتەوە
بە سەر گوڵ و گوڵاوی کاولە سندوسی
هەر کەسانەکی گراوی‌یەکەی[٢] منی نەدیتیەو ناناسی
ئەوەتانی سەری جوانە ماینەکی عەدال و
سەر بە قۆتەرەوە[٣] رادەکێشی

---

(١) قورینگ ، قوڵنگ ، جۆرە باڵندەیێکی ئاوی‌یە لە قاز گەورەترو گەردن درێژترە ٠

(٢) گراوی : دڵدار ، دەزگیران ٠

(٣) قۆتەرە : قۆتەرەی وڵاخ ، پێش چاوکەیەتی ٠

کۆچو کۆچباری خێلی ونسی
ئەی دایە ئەسمەرێ سەد حەیفو موخابن
دەمکوژێتن لە وێ کۆنە دنیایێ
هەر ناکەس بەچەی ئەو عەیامەی
هەردەستیو بە بەر دەرکی مەحبووبە
گچکەلانەکەی من رادەبری
ئەویش لە کۆنەگراوییەکەی من دەپرسی

★ ★

ئەمن بوهارەکم ئەوا گەیوەتی
گەلی برادەرینە
خواکەی هەورێ پایزان
لە کاکی من دەدەن دەورانە
ئەنگۆ لەبۆ من برێن : بە میری رووبارم چنە ؟
ئەگەر دەرێن : میری رووبارم چنارن
بەرێ ئاغایێ رووبارت شەنگەبینە !!
ئەنگۆ لە بۆ من برێن : بە گەردەتێ ئەوی مار وێرانێ
پڕ لە تۆقو تەلەسمو روبابو عەباسیو
سێشایی کەونینە ٠
ئەگەر کلیلی سینگو مەمکی
ئەو بابان وێرانێم داکەوتینە
بەرێ دەرگەوانی سینگو مەمانیم
سنجاقو دەرزینە !!

★ ★

ئەمن بوهارەکم ئەوا گەیوەتی ٠

کەلی برادەرینە

خواکەی سەری‌من دەبێشی

دری منی مار ویرانی گەلەڵ بە کەوایە

ئەگەر کەوێ مار ویران

لە من بوویتەوە تاقو جووتە

بەری سووسکەی خانە خەراپ

لەمن بووین بە ڕەوایە

گەلی برادەرینە

هەر کەسانەکی گراوی‌یەکەی منی نەدیتی‌بەو ناناسی

ئەوەتانی کارو مامزەکی مل بە قەرێتەیەو

چەند شیرن خەوایە(١)

ئەی دایە دەوەرە وەرایە

یا رەبی لەمن‌و لەماری بابەکەی من‌و

دووچاوی بەرەکت کەویتن وەرایە !!



ئەمن بوهارەکم ئەوا گەیوەتێ

گەلی برادەرینە

توخواکەی ئەنگۆ بەدرێ غەریبە ماڵ وێرانێ من

مەکەن بوختانە !!(٢)

(١) خەوایە : خێوراوەتی ، لێی وەشاوەتەوە ٠

(٢) ئەم مەقامەی (بەهار) تەواو نی‌یە ، سێوەش هەر هەندەی دەگوت‌و تەواوی نەدەکرد ٠

**(٥) بەندێك لە مەقامی پاییز[(١)] :ـ**

گەلی برادەرینە ئەمن پاییزەکم گەیبەتی

چ پاییزەکی فەقیرە !!

کە دارە بەنێ ماڵ وێران سێبەری خۆی

لە من دەکاتە سەرتییرە

ئەگەر دری خەرکی ئەو عەیامەی

بریندارە بە شیران ! بە تیران !

بە ماری دنیایێ !!

بەلام دری منی غەریبە ماریێ

بریندارە لۆ کیژۆرەکی چاردە ساران

تازە لە مەمکۆلانی کەرایتەوە شییرە !!

**(٦) مەقامی شەنگ مێرەم :ـ**

ئەم مەقامە سەبارەت بە ناو هێنانی تفەنگی شەشخان ، کە ئەو کات جۆرە چەکێکی نوێ بووە ، لە هەموو دەقی مەقامەکانی دیکەی سێوە نوێتر هۆنراوەتەوە ، زادەی ئاوو هەوایێکی شارستانێتیو هاتوباتی بازرگانی سەدەی نۆزدەهەمی ئەو شارە زیندووەی کۆیەیە ، با بزانین دانەری دەقی مەقامەکە چ بە زمانی دایکی (شەنگ مێرەم) ەوە هەڵ دەبەستێ لە جوانیو ناسكو بەناز پەروەردەیی کچە شۆخو شەنگەکەیداو ، خەریکە چ کراسێکی گرانبەهای بۆ بکرێ تاپێی بچێتە شاییو گۆوەندێ :ـ

---

(١) ئەم پارچە مەقامەی پاییزم لە رۆژی ١٩٧٩/٦/١٠دا لە کۆیە لە کاك عوسمان عەونی شاعیرم وەرگرتووە .

# مەقامی شەنگ میرەم

ئەریّ شەنگیّ ، شەنگە جوانیّ
چاو سەقەریّ ، باڵەبانی (١)
داك حدوودیّ (٢) بیّ نیشانیّ ·
وەی لیّ وەی لیّ

★ ★

برادەرینە ·· دەریّن ئەورۆکە جومعەیە
لە محەلی نیوەرۆییّ
ئەگەر شەنگیّ بەژن برندیّ
دەچیتەوە سەر قەسریّ (٣)
دووەمین هەرامە سارنجیّ (٤) ·
ئەنگوّ لە بەژنی شەنگی بفکرن
چ عەیبانی نینەو عەیبی لیّ مەگرن
چەند بە شیرنیو لاوچاکی
لە قوّری (٥) دەخونجیّن (٦) هەرامە باونجیّ (٧)

★ ★

(١) باڵەبان : جۆرە باڵندەییّکی گۆشت خۆری راوکەرە [ بروانە : فەرهەنگی خاڵ جـ١ ل١٠٤] ·
(٢) حدوود : بە ئەسپو ماینی رەسەنی کوردی دەگوتریّ ·
(٣) قەسر : کۆشکیّکی هاوینییە ، بە جۆریکی وا دروست دەکریّ لـــە هەموولاییّ هەوای فیّنك بیگریّتەوە ·
(٤) سارنج : فیّنکترین شویّنی کۆشکی هاوینییە
(٥) قوّر : قوّڵ ، بازوو ·
( ) دەخونجین : دەنگونجیّن ·
( ) باونج : جۆرە زریزەییّکی زیوی پلپلەدارە ، لە یاخەو زارکـــە قوّڵی کەوای ژنان دەدوورا ·

برادەرینە تاری لە دنیایێ
چەند لە دری من رابوردن
ئەگەر هەنیێ شەنگ میزەمێ
لەبۆ من بمینێ
بەوێ مانگێ لە چاردەی
کەوەتانی خەریك مایتەوە
لە مابەینی هەورو ساماری
ئەگەر مەمکی شەنگێ
لەبۆ من بمینێ بەوی چارقوبەی ئالتوونێ
کەوەتانی عەلی بەگی داسنی(١)
دەیداتەوە لە چار گۆشەی هەرامە مەتاری(٢)
وەی لێ وەی لێ



برادەرینـــە
ئەمن جوابەکی خێرێم زانی بوو
لە لای باش ئاغای لاوەندان(٣)
دەرێن ماچی شەنگێ زێدە هەرزانە
ئەوەتا هاتیتە سەر هەزار قەرە ریاری(٤)
وەی لێ وەی لێ !

---

(١) عەلی بەکی داسنی : سەرداری عەشیرەتی داسنی کورد بووە .
(٢) مەتار : مەتال ، قەلغان .
(٣) لاوەند : بەو سەربازە نانیزامی‌یە یان دەکوت کە دەولەتی عوسمانلی لە لورستانو هەریمی (وەند) بیکی هینابوون .
(٤) قەرە ریار : قەرە ریال : جورە بارەیەکی عوسمانلی بووە .

برادەرینە ٠
دەڕێن سێ بازرگان هاتینە
لەبەری قەتارچیانە
دەڕێن هەر سێکیان وەزیرن !
نا بە خودای هەر سێکیان پاشانە !!
دەڕێن کراسەکیان پێیە
لەبۆ شەنگ مێرەمێ زێدە هەرزانە
وەی لێ وەی لێ !

★ ★

تەتەر (١) دێو رادەبری
داکی شەنگێم دەرێ :ـ « تەتەر مارت وێران بی
قیمەتی ئەو کراسەی لە بۆ من برێ» ٠
تەتەر دەرێ :ـ «قیمەتی ئەو کراسەم ئەوەتانە
بە پێنج صەد سەر بەردیلی (٢) بەر بەرانە
بە پێنج صەد ماینی کەحیلانە (٣)
بە پێنج صەد تفەنگی شەشخانە
بە پێنج صەد هۆقە روونی تەیرانە !!»
داکی شەنگێم دەرێ :ـ
« تەتەر مارت وێران‌بی
ئەگەر شەنگێ ئەو کراسەی
لەبەر بکاتن‌و بچێتە شایی‌و

(١) تەتەر : قاصید ، نامەبەر ، پۆستەچی ٠
(٢) بەردیل : بە مەڕی سێ‌سالآن دەگوترێ [بڕوانە : فەرهەنگی خاڵ ج١ ، ل١٥٤] ٠
(٣) کەحێلان : جۆرە ماینێکی رەسەنی عارەبی‌یە ٠

گۆوەندیو سەیرانە
خەرکی بیبینن داخوا دەرێن
چتو کچەتیمە رەزەوانە !!»
وەی لێ وەی لێ !

(٧) مەقامی نیوەشەو :

دەقە ئەدەبیەکەی ئەم مەقامە لە چاو مەقامەکانی پێشوو جوانترو هونەریی ترە ، وێنەی شیعری ناسكو دەوڕ دابەش کردنێکی شانۆیی جوانی تێدا بەکار هاتووە . وەك رووەكو بابەتی سروشتی وەك شەوبا ، مامڵەتی ئادەمیزادو ئەکتەری شانۆیی لەگەڵدا کراوە . لە سەرەتادا مەقامبێژی ناودار (مەربین) گوتوویەتی . ئینجا (حەنیل)و هاوچەرخەکانی لێیان وەرگرتووەو . لە دوایشدا خوا لێخۆش بووان (سێوە) و (مەلا ئەسعەد)و (ئەحمەدی حمە مەلا) دەیان گوت و ئێستاش مامۆستا (تاهیر توفیق) سەرکەوتووانە دەیڵێو ئەمەش دەقەکەیەتی :ـ

ئەمن نازانم ئەشەوە ئەنیوە شەوە ئەبەری بەیانە
کە وەتانی کەردبابەك دەخوێنی لە گەرەکی ژێری
ئەمن نازانم ئەو کەردبابە نە ئارە نە شینە نە مۆرە
کەوەتانی شەوێ لە سێبارەکی شەوێ بانگ رادێری
منی غەریبە ماریێ شەوێ بە خەبەر دینی (١)



لە گوریێ لە سۆرە گوریێ لە نارنجیێ لە توورونجیێ لە لیمۆیێ
بە عام شرعی خۆیان دەبردەوە کن پیرە شەوبایێ

(١) بەندی یەکەمی مەقامەکە تەنیا لە دەقی (شەعیەی مەربین)دا هەیەو ، سێ بەندەکەی دیکەیان لە دەقەکەی مامۆستا (تاهیر توفیق) یشدا هەیە.

پیرە شەوبایێ مار وێران دەرێ ئەگەر ئەمن چ شرعان بزانم
چ حەرفان لێك بدەم ، شتاقمان بەو خارەی نینە
کەوەتانی لە سوورەتی لەیلایێ ٠



ئەمن ناوێرم دەنگ‌و سەدایێ غەریبە مار وێرانی خۆم هەڵینم
لە ترسی بە ژنەکا برندو دووچاوی بەرەك
ببیتەوە مەترسی‌و هاوارو غەفڵەتە
مەمکێ ئەو بابان وێرانەی لەبۆ من بمینێ
بەوان فنجان‌و فەخفووریان
کە وەتانی لە دیوەخانەکان پێی دەخۆنەوە
قاوە لەگەڵ هەرامە شەربەتە !!



ئەمن بە گەڕەکی ژێری‌دا دەچمەوە خوارێ ٠
لە عامی دەرو جیرانان دەپرسم داخوا شەو چ مەجالە ؟
کیژ دەرێ : هەتیمە لاوە مەجالی نیوە شەوێم لێ بەسەرچووینە
دەم لە سەر ناسکێ روومەتم هەڵبگرە
بەسم شەمامەو شەمامە بەندی باخەڵان بگووینە !!

**(٨) گۆرانی شلەو خانان :ـ**

لە گۆرانی‌یە هەرە کۆنەکانی شاری کۆیەیە ، هەندێ کەس لەو رایەدان کە لەلایەن ئەمین ئاغای ئەختەری شاعیرو مەقامناسی کوردەوە دانرابێ (١) .

(١) بڕوانە : [ ظاهر محمد ـ رەنگاو رەنگ ـ کەرکوك ـ ١٩٧٠] ، ل٣٣ و ل ٧٥ .

بەڵام من وەك سەرنج دەدەمە ووشەو چۆنیەتی داڕشتنی شیعرەکەو زمانە ئەدەبی‌یەکەی ، دێمە سەر ئەو قەناعەتەی کـــە پێش سەردەمی ئەختـــەر داتراب‌و هەبووبێ ، بەڵام ئەوە رێی دەچێتێ لەسەر دەستی ئەو هونەرمەندەوە، رێك وپێکتر خرابێ ٠

ئەم گۆرانی‌یە کۆنە لەسەر ئاوازی مەقامی (بەیات) دەگوترێ خاڵـــە (سێوە) شایی رۆینەی [1] پێ دەگێڕاو ، لە راستیشدا ئەو مەقامە هـــەر بۆ ئیقاعی ئەو جۆرە شایی‌یە دەست دەداو ، دەقی شـــیعرەکەی بـــەم جۆرەیە :

## شلەوخانان

ئاوێ گۆلانم گـەرمە

شـــلەو خـــانان داد ئـــاوێ گـــۆلانم گـەرمە !

هەو هەوێ میرێ مە [2]

---

(١) شایی رۆینە : جۆرە شایێکی خاوی کوردی‌یە . لە کاتی هەڵپەرکێ ـ یەکەدا ، پێ بەرز ناکرێتەوەو شایی‌یەکە راستەو راست دەڕواتو پێی دەگوترا شایی میرو ئاغاو بازرگانان ، چـونکە هـــەڵبەزینەوەو خۆماندوو کردنی تێدانی‌یە ٠

(٢) ئەم دێڕە شیعرە لە دەقی کتێبی [رەنگاو رەنگی کاك ظاهر محمد] و [ ئەختەری شاعیری جوانی‌و دڵداری ـ ئازاد عبدالواحد]و تیپی باواجی کۆیە بەم جۆرە هاتوە کە دەڵێ [ هەوێ میرێ مە ] بەڵام لەکاتی خـــۆی من لە سێوەو ئێستاش لە دەقی خاڵە [ قادری حەمەدی حەمامچی ی گۆرانی بێژی کۆیی ١٩٠٤] ٠ بەم جۆرەی سەرەوەم وەرگرتوە ، واتا : [ هەو هەوێ میرێ مە] کە لە لایەنی مۆسیقاو لەلایەنی ماناوە راستەو دروستترە ، چونکە (هەوە هەو) جۆرە ئەعلەتەیێکی سوارو شەڕکەرانی سەردەمی رابوردووی کورد بووە ٠

